سلسلة القادة والفاتحون

زنجیرەی ژیانی پیاوە گەورەکانی مێژووی
ئیسلامی لە جەنگ و جیهاد و ڕزگار کردنی خاکی موسوڵمانان

ملك الملثمين

# يوسف بن تاشفين

## پێشەوا و ڕزگاری خوازی موسوڵمان لە مەغریبەوە بۆ ئەندەلوس
## و سەرکردەی دەوڵەتی (المرابطين) و تێکۆشەری سەدەی (10)ی زانیینی




ئامادەکردن و وەرگێڕانی

أیمام عبدالله

زنجیرەی سەرمەشق و پێشەنگانی
کاروانی جیهادوو ڕزگاری ( ١ )

# پادشای دەمامکداران
# (ملک الملثمین)
# یوسفی کوڕی تاشفین

پێشەواو ڕزگاری خوازی موسوڵمان لە مەغریبەوە بۆ ئەندەلوس
سەرکردەی دەوڵەتی (المرابطین) و تێکۆشەری سەدەی دەیەمی ی زانیینی

ئامادەکردنی
ئیمام عبداللە

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، اللهم لا سهل إلا ما جعلته سهلا وأنت تجعل الحزن إذا شئت سهلا.

أما بعد:

ناوی (یوسف کوری تاشفین ئەلمتونی) یە، ناسراوە بە (أبو یعقوب)، سوڵتانی مەغریبی سەرو، وە یەکەم کەس بوو کە ناز ناوی (امیر المسلمین)ی پێدرا .

لە صەحرای مەغریب لە دایك بووە، وە کوڕە مامی کە ناوی (ابو بکر بن عمر ئەلمتونی)بوو، ئیمارەی (البربر)ی بەڕێوە دەبرد، کە تەواوی شێخ و ڕەئیس عەشیرەتەکانی (مرابگین) بەیعەت یان پێدابوو، بەم جۆرە زۆر بەهێز بوو بوو، وە دەستی گرت بەسەر شاری (فاس) دا، پاشان ڕووی کردە مەغریب، وە لە ساڵی (465) ی هجریدا شاری (مەراکیش)ی بنیات نا.

وە لە ساڵی (475)ی هجریدا (المعتمد بن عباد) خۆی ئامادە کرد بۆ شەڕو کوشتاری (ئیفرنج)ەکان، لە (ئیشبیلیە) لە وڵاتی (ئەندەلوس)، بە سوپایەکی زۆرەوە هێرشی بردە سەر (ئیفرنج)ەکان، و بەسەریاندا سەرکەوت لە ناوچەی (الزلاقە) لە ساڵی (479)ی هجری، پاشان دەستی گرد بەسەر تەواوی ناوچەکانی دیکەی وڵاتی (ئەندەلوس)، بەم جۆرە دەسەڵاتی بڵاو بوویەوە بۆ مەغریبی ناوەراست و سەرو و جەزیرەی ئەندەلوس.

وە لەم کتێبەدا هەموو ئەوشتانە دەزانین لەبارەی ئەمیری موسوڵمانان و، دەسەڵات داری مەغریب ، یوسف بن تاشفین، رحمە الله.

## لە یەمەنەوە .. بۆ مەغریب

کاتێك ئایینی ئیسلام لە جەزیرەی عەرەبیدا بڵاو بوویەوە، هۆزەکانی (حمیر) لە ناوچەی یەمەن چوونە ناو ئایینی ئیسلامەوە، وە هۆزی (متونە)ش یەکێك بوون لەو هۆزانە، وە لە زەمانی ئەبو بەکری صدیق (خوای لێ ڕازی بێت)، سەرەتای فتوحاتە ئیسلامی یەکان دەستی پێکرد، کە لەسەرەتادا لە ناوچەی یان ناحیەی (شام)ەوە بوو، کە هەموو هۆزەکانی (حمیر)ی یەمەنی بەژداری ئەو فتوحاتانە بوون، وە ئەم فتوحاتە بڵاو بوویەوە هەتا تەواوی خاکی (شام) ڕزگار کرا، وە لە سەردەمی (الفاروق) عومەری کوری خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت)، عەمروی کوری عاص ویستی خاکی (میصر) ڕزگار بکات، وە ئیمامی عومەر بەمە ڕازی بوو، وە پشت گیری عەمروی کرد، بەم جۆرە عەمروی کوری عاص بە سوپایەکی زۆرەوە لە خاکی (شام)ەوە بەرێ کەوت بەرەو خاکی (میصر)، وە هۆزەکانی (حمیر)یش لە گەڵیدا بەژدار بوون، وە بەردەوام بوو لەشەڕ کردن دژی ڕۆمەکان، هەتا خاکی (میصر)ی ڕزگار کرد، وە هەندێك وڵاتی دیکە لە باکوری ئەفریقیا، وەك وڵاتی (سودان).

## لە دایك بوون و گەورە بوون

لە صەحرائی باشوری مەغریب هۆزێك هەبوو بە ناوی (المتونە)، کە پیاو چاکێك و چاو نەترسێك یان تێدا بوو بەناوی (تاشفین بن ابراهیم)، کە خوای گەورە کوڕێکی پێدا بە ناوی (یوسف)، ئەمەش لە ساڵی (410) ی هجری بەرامبەر بە (1019)ی زایینی بوو.

یوسف کوری تاشفین منداڵێکی ئەسمەر پێست بوو، لەش و لارێکی نەحیف و لاوازی هەبوو، هەر لە منداڵی یەوە لەسەر سوار چاکی و ئازایەتی پەروەردا کرابوو، وە فێری نوسین و خوێندنەوە بووبوو، وە ئیسلامی زۆر خۆش دەویست، وە بەردەوام پێی وابوو کە هەر ئیسلامە دینی هەق و دەبێت هەموو دونیا شوێنی بکەوێت.

کاتێك یوسف کوری تاشفین بوویە گەنجێکی پێگەیشتوو، شمشێری هەڵگرت و، ڕۆشت بۆ بەژداری کردن لە گەڵ هۆزەکەی بۆ شەڕو کوشتار دژی ئەو هۆزانەی دژی ئیسلام دەوەستانەوە، وە شەڕو کوشتاری ئەو کەسانەی کە دارو بەردو بتیان دەپەرست، لە باشوری مەغریب، بەم جۆرە هۆزی (المتونە) بوونە دەسەڵات دارترین هۆز لەناو هەموو هۆزەکانی دیکەدا .

## پێشەوای دەمامکداران (الملثمین)




کاتێك (یوسف بن تاشفین) تەمەنی بوو (37) ساڵ، کە ئەمە بەرامبەر بوو بە ساڵی (447)ی هجری، پیاوێکی زانا و شارەزا لە ئایینی ئیسلام بە ناوی (عبدالله کوری یاسین) هەستا بە دروست کردنی ڕێکخراوێك لە خەڵکی، کە ئامانج و مەبەست یان بریتیی بوو لە فەرمان کردن بە چاکە (الامر بالمعروف)، و ڕێگری کردن لە خراپە (والنهی عن المنکر)، و بڵاو کردنەوەی زانستە ئیسلامی یەکان، وە (یەحیا)ی کوری (عومەر) سەرۆکی هۆزی (المتونه) چووە پاڵ (عبدالله ی کوری یاسین)ی فەقیهەوە، بەم جۆرە ئەندامەکانی ئەم ڕێکخراوە زیادی کرد هەتا گەیشتە نزیکەی زیاتر لە (1000) پیاو، وە (یەحیا) هەستا بە بنیات نانی دەوڵەتی (المرابطین)، کە پێیان دەووتن: (الملثمین)، چونکە ئەوان پەرچە یان قوماشیان دەگرت بە دەم و چاو (ڕوخسار)یاندا ...

بەم جۆرە (یەحیای کوری عومەری ئەلمتونی) توانی خەڵکێکی زۆر کۆبکاتەوە، وە هەتا دەهات دەستیان دەگرت بەسەر وڵاتانی دەورو بەری مەغریبدا، وە زانستە ئیسلامی یەکانیان بڵاو دەکردەوە، وە شەڕو کوشتاری دارو بت پەرستەکانیان دەکرد، وە لەم کاتەدا (یوسف بن تاشفین) یەکێك بوو لە قادە گەورە دڵسۆزەکانی ئەو ڕێکخراوە ...

وە لە ساڵی (448)ی هجریدا، (یەحیای کوری عومەری ئەلمتونی) گیانی لە دەستدا، وە پاش خۆی (ئەبو بەکر)ی برای بووە جێگری یەحیای برای، کە ئەبو بەکر زۆر ئازاتر و پێداگر تربوو لە براکەی، بەڵێ ئەوەبوو توانی دەوڵەتی (الملثمین) لە خاکی مەغریب ببات بەرێوە، وە توانیان رایەی ئیسلام و یەکتاپەرستی بەرز ڕابگرن، وە توانیان دەست بگرن بە زۆرێك لە وڵاتانی (سەلجماسە) و (وسو) و غەیری ئەوانیش، وە توانیان خەڵکێکی زۆریان لێ بکوژن و لەناو بەرن .

وە لە ساڵی (461)ی هجری و (1068)ی زایینی دا، شەڕێکی گەورە لە نێوان (الملثمین) و ( برغواگە )ە مەغریبی یەکاندا هەڵگیرسا، وە لەم شەرەدا (عبدالله ی کوری یاسین) کوژرا، لەگەڵ

ئەمەشدا (الملثمین)ەكان سەركەوتن بە قیادە و پێشەوایەتی (بكر بن عمر)، وە ئەبو بەكر بەتەنها خۆی مایەوە، وە (یوسف بن تاشفین) كە كورە مامی بوو، واتە ئامۆزای بوو، كردی یە پێشەوای (الملثمین)ەكان، ئیتر بەم جۆرە بۆخۆی دەرچوو بۆ شەرو كوشتاری بت پەرستەكان، لە باشوری مەغریب، بۆ لەناو بردن و بن بڕكردنی فیتنە و ئاشوبیان ....

وە یوسف بن تاشفین چەند سیفاتێكی تێدا بوو، كە بەهۆیەوە لەناو خەڵكیدا خۆشەویست بوو بوو، لەوانە كەسێكی زیرەك و هۆشیار بوو، وە كەسێكی حازیم و دوور بین و ئازا بوو، وە تواناو لێهاتوویيەكی بەرچاوی هەبوو لە پێشەوایەتی و سەركردایەتی، بەم جۆرە خەڵكی لەدەوری كۆبونەوە و خۆشیان ویست و پشت گیری و گوێڕایەڵی یان كرد ...

## دەسەڵاتدار و سوڵتانی مەغریب

لە ساڵی (463)ی هجریدا (ئەبو بەكر بن عمر المتونی) گەڕایەوە بۆ باشور، وە سەركەوت بەسەر بت پەرستەكاندا، وە فیتنە و ئاشوبی شیرك و كوفری دانیشتوانی باشوری مەغریبی بنە بڕكرد، بەڵام بینی یوسف بن تاشفین لەناو خەڵك و سوپادا جێگە و مەكانەتێكی بەرز و تایبەتی خۆی هەیە، وە بینی یوسف بن تاشفین تواناو لێهاتوی یەكی جیاوازی هەیە بۆ بەڕێوە بردنی كردەوە سیاسی و عەسكەری یەكان، وە كەسێكی كار بەجێ یە بۆ مەصالیح و بەرژەوەندی یەكانی وڵاتەكەی، وە كەسێكی خاوەن بڕیار و عەزیمەتە، بۆیە ئەبو بەكری ئامۆزای بەرەسمی دەستی لە دەسەڵات و سوڵتە كێشایەوە، وە یوسف بن تاشفینی بە رەسمی كردە جێگری خۆی، وە بەم جۆرە یوسف بن تاشفین بوویە پاشا و پێشەوای دەوڵەتی (المرابطین) لە خاكی مەغریب.

یوسف بن تاشفین لەناو شوێن كەوتوەكانی بە ئازاو شەجاعەت ناسرابوو، هەر وەك چۆن داد گەرو عادل بوو، بەم جۆرە سوپاكەی زۆر بوو، وە هەتا دەهات پاشاو مەلیكەكانی دەورو بەری ترسیان لێ زیاتر دەبوو، چونكە یوسف بن تاشفین كەسێكی زیرەك و لێهاتوو بوو، وە بەردەوام لە وتارو خوتبەكانیدا باسی لەوە دەكرد كە ئەو شوێن كەوتەی خەلیفەی موسوڵمانانی عەباسی یە لە ڕۆژ هەڵات، وە باسی خەلیفەی عەباسی دەكردو بەردەوام دوعای خێری بۆ دەكرد لەسەر مینبەر و لە وتارەكانیدا .

یوسف بن تاشفین لەكاتی دەسەڵات دارێتیدا هەستا بە كۆمەڵێك پرۆژە و كاری گەورە و گرنگ، لەوانە هەستا بە بنیات نانی شاری (مەراكیش) لە ساڵی (465)ی هجریدا، وەشوێنەكەی

کردە نزیکی دەریا، وە هەروەها شاری (تاجرە)ی بنیات نا، کە شارێکی بچوکە لە دەشتی (تلمسان) بوو لە مەغریب.

وە یوسف بن تاشفین شاری (مەراکیش)ی کردە پایتەختی دەوڵەتەکەی، هەتا بیکاتە مەرکەزی دەرچوون و ئینتلاقی یەکتاپەرستی و کۆ کردنەوەی هەموو هۆزەکان، لە ئەوسەری ڕۆژئاواوە، لە ژێر ڕکێفی خۆیدا، بە مەبەست و نیازی دەوڵەتێکی بەهێز و دەسەڵات .

بەم جۆرە یوسف بن تاشفین هەستا ڕێك خستنی کەشتی گەلێکی دەریایی گەورە، کە یارمەتی بدات لە خستنە پاڵی ناوچە شاخاوی یەکان لەسەر تەنگایی شاخی (طارق)، هەتا بەهۆیەوە ناوەراستی مەغریبی بۆ نزیك ببێتەوە، هەتا بەو جۆرە تەواوی هەموو مەغریب بێنە ژێر چنگ و دەسەڵاتی خۆیەوە...

وە یوسف بن تاشفین هەستا بە دروست کردنی پەیوەندی سیاسی لەگەڵ دراوسێکانیدا لە فەرمان ڕەواکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات، وە کۆمەڵێك کەسی لەدەوری خۆی دانا، کە هەڵدەستان بە راپەڕاندنی کارو باری دەوڵەت، وە دەوڵەتەکەی بویە وێنەی دەسەڵاتێکی پاشایەتی ...

## بەڕێ کەوتن بەرەو ئەندەلوس

لە کاتێکدا کە یوسف بن تاشفین توانی هەموو خاکی مەغریب یەك بخات، وە رایەی ئیسلام سەربخات تێیدا، وە هێز و دەسەڵاتی دین دەربخات، لەهەمان کاتدا خاکی ئەندەلوس لەلایەکی ترەوە لە دەریای ناوەراستەوە، بەتەواوەتی پێچەوانەی ئەم حاڵەی خاکی مەغریب بوو، وە دەیناڵاند بە دەست لاوازی و ستەمەوە، وە لەلایەن پاشای ئەو هۆزانەوە فەرمان ڕەوایی دەکرا، کە ڕووبەڕوی مەترسی داگیر کاری ڕۆمەکان ببونەوە، وە دەیان ناڵاند بەدەست دەسەڵاتی ستەم کارانەی پاشاکانیان و داواکاری یەکانیان لەلایەن پاشا کانیانەوە لەو شتانەی کە دەسەڵاتیان نییە لە بارەیەوە، وە لە تەواوی ئەو ماوەدا لە خاکی ئەندەلوس کەسێك نەهات کە ڕیزەکان کۆ بکاتەوە لە ژێر یەك رایەدا، وە هەموو دەستەیەك دەستیان گرتبوو بەسەر ناوچەیەکدا، وە بەم جۆرە هەموو دەستە و حیزبێك بەخۆی خۆش بەخت بوو بوو، وە هیچ شتێك لایان گرنگ نەبوو جگە لە خۆشی و ڕەغەباتی ژیانی خۆیان نەبێت .

وە یوسف بن تاشفین هەموو کات بەردەوام بە چاوی بێتاقەتی و حەزینەوە سەیری خاکی ئەندەلوسی دەکرد، وە زۆر بە ئەسەفەوە بوو لەوەی موسوڵمانان بەسەر یان هاتووە لە خاکی ئەندەلوس، وە بەردەوام بیری دەکردەوە لە حاڵی ئیسلام لەو وڵاتەدا، لەوەی خاچ پەرستەکان پێ

یان دەکەن، وە ڕووی دەکردە خوای گەورە بە پاڕانەوە، وە داوای نەصر و سەرکەوتنی دەکرد لێی، وە داوای دەکرد ئیسلام بە هێزو شەوکەوتەوە بگەڕێتەوە بۆ خاکی ئەندەلوس، خۆ ئەگەر کەسێك قسەی لەگەڵدا بکردایە لە بارەی خاکی (ئەندەلوس)ەوە دەیووت: من یەکەم کەس دەبم بۆ سەرخستنی ئەم دینە لەو خاکە، وەهیچ کەس هەڵناسێت بەم کارە جگە لە خۆم ...

ئەوە بوو لە ساڵی (475)ی هجریدا، مەجالێکی زێڕین هەڵکەوت بۆ یوسف بن تاشفین، کە هەستێت بە جێگەیاندنی ئەو شتەی کە بەردەوام ئاواتی بۆ دەخواست، کاتێك کاربەدەست و فەرمان ڕەواکانی ئەندەلوس هاتن و پەنایان برد بۆ یوسف کە ڕزگاریان بکات لە خاچ پەرستەکان، بەوەی کە خاچ پەرستەکان سوپایەکی زۆریان بە چەك و جبە خانەیەکی زۆرەوە ئامادە کردووە بۆ هێرش کردنە سەر خاکی ئەندەلوس و، لەناو بردنی موسوڵمانەکان، وە یەکەم پێشەوا کە پەنای برد بۆ یوسف (المعتمد بن عباد) پێشەوای (ئیشبیلیە) بوو، وە یوسف زۆر باش گرنگی شاری (ئیشبیلیە)ی دەزانی، بەنیسبەت موسوڵمانەکانەوە، چونکە گەورەترین شاری ئەندەلوس بوو، دەکەوێتە سەر ڕوبەرێکی زۆر لە خاکی ئەندەلوس، وە (15) دەرگای هەیە، وە نزیکە لە دەریاوە، کاتێك یوسف بینی (المعتمد بن عباد) هانای بۆ هێناوە، خێرا چوو بەدەم داواکەیەوە، وە سوپایەکی زۆر و بەهێزی بۆ ئامادە کرد، وە کەشتی گەلێکی گەورەی ڕێك خست، وە بەڕێ کەوت هەتا گەیشتە دەریا، وە پێش ئەوەی بگات بە دەریا دەستی بەرز کردەوە ڕووە و ئاسمان، وە پاڕایەوە لە خوای گەورە بەمە: **((أللهم إن كنت تعلم أن في جوزنا (أي اجتياز البحر) هذا خيرا للمسلمين فسهل علينا جواز هذا البحر، وإن كان غير ذلك فصعبه حتى لا أجوزه)).**

پاشان یوسف بن تاشفین فەرمانی کرد بە پەڕینەوەی سەربازەکانی بەناو ڕووباری دەریای ناوەڕاستدا بەرەو خاکی ئەندەلوس لەسەر بەرەکەتی خوای گەورە.

## جەنگی (الزلاقه)

یوسف بن تاشفین بە خۆی و سوپا و کەشتی گەلەکەوە دابەزی یە ناو خاکی ئەندەلوس، وە سوپای موسوڵمانان لە خاکی ئەندەلوس چونە پاڵ ڕیزی سوپای یوسفەوە، وە سوپای (نەصارا) خاچ پەرستەکان لە کۆمەڵێکی زۆر گەورەدا کۆبونەوە لەژێر پێشەوایەتی (الفونسو السادس) فونسوی شەشەم، وە بە تەواوەتی لەسەر گرتنی شاری (ئیشبیلیە) پێگیر ببوون ...

وە سوپای موسوڵمان بە پێشەوایەتی یوسف بن تاشفین کەوتنە جوڵە، وە گەیشتن بە سوپای خاچ پەرستەکان بە پێشەوایەتی (فونسوی شەشەم)، لە شوێنێك کە پێیان دەوت:

(الزلاقه)، نزیك شاری (قرطبه)، ئەمەش لە ساڵی (480)ی هجری بەرامبەر بە (1087)ی زایینی بوو، لەم شوێنەدا جەنگ و کوشتار لە نێوان هەردوو سوپاکەدا هەڵگیرسا، سوپای ئیمان و سوپای کوفر، کە شەڕێکی زۆر قورس و خوێناوی بوو، کە موسوڵمانان گیان و نەفسی خۆیان کردە فیداو قوربانی دینی خوای گەورە و بەرز گرتنی رایە و کەلیمەی خوای گەورە، وە جەنگ و کوشتارەکە چەند ڕۆژێك درێژەی کێشا، هەتا سەرکەوتنی خوایی دابەزی بۆ سەر موسوڵمانەکان، وە خاچ پەرستەکان بە خۆیان و چەك و جبە خانەیانەوە تێك وپێك شکان، وە یوسف بن تاشفین و سوپاکەی سەرکەوتن سەرکەوتنێکی بێ وێنە، وە شەوکەوت و قووەتی خاچ پەرستەکان تێك شکا، تێك شکانێکی زۆر گەورە، وە ئیمان دارەکان زۆر دڵ خۆش بوون بە نەصرو سەرکەوتنی یان لەلایەن خوای گەورەوە بەسەر خاچ پەرستەکاندا، وە دوای ئەمە، یوسف بن تاشفین خاکی مەغریب و ئەندەلوسی یەك خست و کردنی یە ژێر پێشەوایەتی و فەرمانی تایبەتی خۆیەوە ...

پێشەوا و ئەمیری موسوڵمانان

دوای ڕووداوەکەی (الزلاقه)، یوسف بن تاشفین هەستا بە کۆمەڵێك کارو پڕۆژەی گەورە لە خاکی ئەندەلوس، وە تەواوی پاشاکانی ئەندەلوسی کۆکردەوە، کە ژمارەیان (13) پاشا بوو، وە پێك هاتن و یەك کەوتن لەسەر ئەوەی کە بەیعەت و پەیمان بدەن بە (یوسف بن تاشفین) بەوەی کە ئەمیرو پێشەوا یان بێت، کاتێك شێخ و سەرۆك هۆزەکانی دەوڵەتی (المرابطين) لە مەغریب ئەمەیان بینی، ئەوانیش بەهەمان جۆر کۆبونەوە لەلای، وە پێیان ووت تۆ خەلیفەی خوای گەورە لە مەغریب و ئەندەلوس، وە زۆر لەوە زیاترت شایەنە کە پێت بڵەین ئەمیر، بەڵکو بانگت دەکەین بە ئەمیرالمؤمنین، واتە پێشەوای باوەر داران، یوسف ووتی: حاشا للە ئەگەر ناوم بنێن بەو ناوە، کە بمکەنە ڕیزی خەلیفەکانەوە، وەمن پیاوی خەلیفەی عەباسیم، وە بانگ خوازم لە مەغریب بۆی، پێیان ووت: دەبێت ئیلا ناز ناوێکی چاکت هەبێت، یوسف ووتی: ئەگەر هەر پێداگری دەکەن با ئەمیری موسوڵمانان بێت، واتە با ئەوە ناز ناوم بێت، ئەوانیش ڕازی بوون و هەموویان لەسەر ئەم ناوە پێك هاتن ...

پاش ئەمە یوسف بن تاشفین هەستا بە دەرکردن و دروست کردنی دراو (السكه)، وە دینارێکی دروست کرد کە نەخشی (لاإله إلاالله محمد رسول الله)ی لەسەر کێشرابوو، ئەمەش لەبەر بەرز ڕاگرتنی، وە لە ژێرەوەدا نوسیبوی، (أمير المسلمين يوسف بن تاشفين)، وە لە ناوەراستدا نوسیبوی [وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ]العمران 85).



وە لە ڕوی ئەودیوی پارەکە نوسیبوی: الامیر عبدالله أمیر المؤمنین العباسی، وە لە لێوارەوە ساڵ و شوێنی لێدانی پارەکەی نوسیبوو ...

## گێڕانەوەی ئەندەلوس

یوسف بن تاشفین زۆر پێداگر بوو لەسەر ڕزگار کردن و فەتحی خاکی ئەندەلوس، وە گێڕانەوەی تەواوی ناوچەکان بۆ ژێر ڕکێفی ئیسلام جارێکی تر، وەك چۆن لە پێشتردا بەو جۆرە بوو، وە پاش تێك شکانی (فونسوی شەشەم) لە ناوچەی (الزلاقە)، وە توانی تێك ڕژانی خاچ پەرستەکان بەرەو ڕووی ئەندەلوس بوەستێنێ، بڕیاری ڕزگار کردنی تەواوی ناوچەکانی دیکەی ئەندەلوسی دا، وە سەرەتا لە (غەرناطە)وە دەستی پێکرد، کە شارێکی گەورەی ئەندەلوسە، کە سوپای ئیسلامی بۆ چووبو، وە لەسەر (غەرناطە) کۆتا پاشای (صنهاجی) عبدالله بن بلکین مابویەوە، وە یوسف توانی (غەرناطە) بگرێت و بچێتە ناوی، وە (ابن بلکین)ی گرت و لەگەڵ خۆیدا گەراندەیەوە بۆ (مەراکیش) لە مەغریب.

وە یوسف لە پەیوەندی کردن بە ئەندەلوسەوە مایەوە، وە سوپاکەی لە ژێر پێشەوایەتی (شیر بن ابی بکر) دا بەڕێ کرد، وە پێشەوا (شیر) سەرەتا دەستی کرد بە ڕزگار کردن و فەتحی ئیماراتی (ئەندەلوس)ی، وە دەستی گرت بەسەر شاری (طرطوشە)ی ڕۆژ هەڵاتی (قرطبە)، پاشان دەستی گرت بەسەر شاری (شاطبە) پاشان شاری (دانیە) پاشان شاری (مرسیە) پاشان شاری (بطلیوس) وە جگە ئەوانیش، هەتا دەسەڵاتی تەواوەتی لە جەزیرەدا سەپاند ...

## خۆشەویستی بۆ عیلم و عولەماکان

یوسف بن تاشفین پیاوێکی زۆر حەلیم و موتەقی و، چاکە کار بوو، شوێن کەوتوان و ئەهلی عیلمی زۆر خۆش دەویست، وە دەسەڵاتی پێدەدان لە وڵاتەکەیدا، وە زۆر ڕێزی دەگرتن، خۆ ئەگەر زانایەك باسی شتێکی بۆ بکردایە زۆر بە ترسەوە گوێبیستی دەبوو، وە زۆر بە شەوقەوە دڵی دەدایێ ...

وە یەکێك لەو هەڵوێستانەی کە لێبوردەی و گەورەیی و کەرەمی تێدا دەرکەوت، ئەوەیە کە دەگێڕنەوە کە جارێك یان (سێ) پیاو کۆبونەوە، لەناو خۆیاندا وتیان: یەڵا با ئاوات بخوازین، یەکیان ئاواتی ئەوەبوو کە (هەزار) دیناری هەبێت و توجارەتی پێوە بکات، وە ئەوی تریان ئاواتی ئەوە بوو کە کار بکات بۆ پێشەوای موسوڵمانان، وە ئەوی سێهەمیان ئاواتی ئەوە بوو کە (النفزاویە) بخوازێت و ببێتە ژنی، وە ئاشکرایە کە (النفزاویە) خێزانی ئەمیری موسوڵمانانە، واتە (یوسف بن تاشفین)، کە چاك ترین و جوانترین ئافرەت بوو، وە نازناوێکی گەورەی هەبوو لە دەوڵەتدا ...

ئەمە گەیشتەوە بە یوسف بن تاشفین، ئەوە بوو ناردی بە شوێن ئەو (سێ) کەسەدا، وە هاتن، ئەوەی یەکەمیان هەزار دینارەکەی پێدا، ئەوەی دووهەمیشیان کردیە کاربەدەست لای خۆی و کارێکی دایە دەست، بەڵام بەوەی سێهەمیانی ووت: ئەی نەزان (جاهل)، ئەو ئاواتە چی بوو کە هەرگیز پێی ناگەیت؟ پاشان ناردی بۆلای خێزانەکەی (النفزاویە) بۆئەوەی رای خۆی بدات لەسەری .

پاش ئەوەی (النفزاویە) خێزانی ئەمیری موسوڵمانان بەمەی زانی، فەرمانی کرد بە دروست کردنی خێمەیەك، یان چادرێك، وە پیاوەکەی (سێ) ڕۆژ تێدا هێشتەوە، وە فەرمانی کرد هەر (سێ) ڕۆژەکە یەك جۆر خواردنی بۆ بەرن، پاشا (سێ) ڕۆژەکە فەرمانی کرد کە پیاوەکە بهێنن بۆلای، پاش ئەوەی هات و لەبەردەمیدا وەستا، (النفزاویە) پێی ووت: ئەم (سێ) ڕۆژە چیت خوارد؟ ووتی : هەر یەك جۆر خواردن، ئەویش ووتی: دەبزانە هەموو ئافرەتەکان یەك شتن، پاشان پارەو پۆشاکی پێدا و ئازادی کرد ...

## مردنی

ناز ناوی ئەمیری موسوڵمانان (یوسف بن تاشفین) بە تەواوی لە مەغریبی ناوەراست و جەزیرەی ئەندەلوس دا بڵاو بویەوە، وە زانایانی شەرق نازناوی خۆشەویستی یوسفیان بۆ ئەهلی عیلم بیستبوو، وە ئیمامی (ئەبو حامدی غەزالی) لە میصر، کاتێك نازناوی یوسفی بیست لەو سیفاتە چاکانە، وە مەیل و ویستی بۆ ئەهلی عیلم، بڕیاری دا بە سەردان کردنی بۆلای ...

وە گەیشتە (ئەسکەندەری)یە، وە بڕیاری ئامادە کردنی هەموو پێداویستی یەکانی دا، بەڵام پێش ئەوەی دەربچێت هەواڵی مردنی ئەمیری موسوڵمانان (یوسف بن تاشفین)ی پێگەیشت، ئیتر ئەوە بوو (ئەبو حامدی غەزالی) گەرایەوە و لە بڕیارەکەی پەشیمان بوویەوە...

وە مردنی ئەمیری موسوڵمانان (یوسف بن تاشفین) لە ساڵی (498)ی هجری بەرامبەر بە (1104)ی زایینی بوو، بەهۆی توش بوونی بە نەخۆشی یەوە، وە لە شاری (مەراکیش) لە مەغریب بەخاك سپێر درا، وە ڕۆژی مردنەکەی تەمەنی (88) ساڵ بوو، وە ماوەی دەسەڵاتی (35) ساڵی خایاند، وە فەرمانی کرد پاش خۆی (علی) کوڕی ببێتە جێگری ...

خوای گەورە لە ئێمە و ئەمیری موسوڵمانان (یوسف بن تاشفین) خۆش ببێت، وە پاداشتی بداتەوە لەوەی بۆ ئیسلام و موسوڵمانانی کرد چاك ترین پاداشت

وصلی الله وسلم علی نبینا محمد وعلی اله وصحبه وسلم

